# چی دەکەی!؟
# بۆ کۆرپەکەت

## چەند خاڵێکی گرنگ بۆ کۆرپەی تازەبوو



نووسینی
فەرمان خەرابەیی

چاپی یەکەم 2012

# چی دەکەی!؟ بۆ کۆرپەکەت

نووسینی

*فەرمان عزیز نەجار خەرابەیی*

چاپی یەکەم
هەولێر ۲۰۱۲

مافی لە چاپدانی پارێزراوە بۆ کتێبخانەی ئەنجوم

پێناسەی کتێب

ناوی کتێب: چی دەکەی بۆ کۆرپەکەت؟!

نووسینی: فەرمان خەرابەیی

بابەت: پەروەردەی کۆمەڵایەتی.

چاپ: یەکەم – هەولێر ٢٠١٢

چاپ: چاپخانەی منارە – هەولێر (٠٧٥٠٤٤٥٦٢٩٧)

تیراژ: ( ١٠٠٠) دانە.

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٥١١)ساڵی (٢٠١٢) پێدراوە

# پێشـــەکی

یەکێك لـە بەخشش و نعیمەتـەکانی خـوای گـەورە بەسـەر بەنـدەکانی منداڵ پێ بەخشینە، منداڵ بەخششێکی خوای گەورەیە لـە دونیـا و لـە دوا رۆژ بۆ دایك و باوك، خوای گەورە دەفەرمووێ:

﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةٗ ﴿٧٢﴾﴾( **النحل**:٧٢).

واتـــە: خوای گەورە لـە خۆتان هاوسەرانی بۆ فەراهەم هێناون، هەر لـە رێگای هاوسەرانتانەوە کوڕ و کورەزای پێ بەخشیوون.

**بەڵێ**: منداڵ بەخششێکی خوای گەورەیە و ئەمانەتێکیشـە لـە ئەسـتۆی ئێمە، بۆیە ئێمە بەرپرسیارین لـە پێدانی مافەکانی، دەبێت منـداڵ چ مـافێکی بەسەرمانەوەیە پێی بدەین تا لـە دوا رۆژ لـەبەر دەستیان ئیسراحەت بکەین و سوودیان بۆ مان هەبێت، بۆیە پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: «وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُمْ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ عَلَـى بَيْـتِ بَعْلِهَـا وَوَلَـدِهِ، وَهِـيَ مَسْئُولَةٌ عَنْهُمْ»(١).

جا لـەم نامیلـکەیەدا چەند خاڵێکی گرنگم ڕوونکردۆتەوە کـە سـوننەت و پێویستە بۆ منداڵ بکرێت لـەوکاتەی لـە دایك دەبێت.. بە ئومێدی هـەموو لایەك لێی سوودمەند بینین.

**فەرمان خەرابەیی**

**هەولێر:١١/ ١/ ٢٠١٠ ز**

(١) **صحيح**: رواه البخاري ( ٧١٣٨ ) ومسلم (١٨٢٩).

# ئەو سوننەتانەی بۆ منداڵی تازە لە دایك بوو دەکرێت

لەو کاتەی منداڵ لە دایك دەبێت پێویستە پەروەردەکاری ئەو منداڵە چەند شتێك ئەنجام بدات، لەوانە:

○ **مژدە پێدانی منداڵ بوون:** ئەوانەی منداڵەکە ڕزگار دەکەن، یان ئاگایان لە ڕزگار بوونی منداڵەکە هەیە، سوننەتە ئەم مژدەیە بە خانەوادەی منداڵەکە بگەیەنن بە تایبەت باوك و دایکی منداڵەکە، جا کوڕبێت یان کچ، چونکە مرۆڤ بە مژدە پێدانی لە ناکاو دڵخۆش و کامەران دەبێت.

دەبینین قورئانی پیرۆز لە چەندەها شوێن، مژدەی منداڵ بوونی داوە بۆ دڵخۆش کردنی بەندەکەی، خوای گەورە بەم شێوە مژدە بە (زکریا) دەدات: ﴿ فَنَادَتْهُ الْمَلآئِكَةُ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ أَنَّ اللّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَـى ﴾ (ال عمران:٣٩). واتە: لە کاتێکدا (زکریا) لە میحراب وەستابوو نوێژی دەکرد جبریل بانگی کرد و وتی بەڕاستی خوای گەورە مژدەت دەداتێ بە بەخشینی کوڕێك بە ناوی (یحیی).

لە کتێبی سیرەشدا هاتووە کە کاتێك هەواڵی لە دایك بوونی (محمد)ﷺ گەیشتە مامەکانی: (ابو لهب)ی مامی کەنیزکێکی هەبوو بەناوی (ثُوَيبَة)ـە لە خۆشی ئەو مژدەیە ئازادی کرد، یەکەم کەسیش کەشیریدا بە پێغەمبەر ﷺ هەر ئەم (ثُوَيبَة)ـە ئازادکراوە بوو[٢].

(٢) بڕوانە: (ژیانی پێغەمبەری مەزن) (ل:٦٧)، دانراوی: عبدالعزیز پارەزانی.

**پیرۆزبایی لێکردن:** کاتێك خوای گەورە کۆرپەیەك بە بەندەیەکی خۆی دەبەخشێ، سوننەتە دۆست و یارەکانی پیرۆزبایی لێ بکەن و دووعای خێری بۆ بکەن[٣] بۆ ئەوەی رۆڵەکەی (صالح) بێت پێی بڵێن: «باركَ اللهُ لكَ وباركَ في الموهوبِ لكَ، وشَكَرتَ الواهبَ، وبَلَغَ أشُدَّهُ، وَرُزِقتَ بِرَّه» واتە: خوا منداڵەکەت لێ پیرۆز بکات، شوکرانە بژێری خوای بەخشندەی لەسەر بکەی، خوا تەمەنی درێژ بکات وچاکەی منداڵەکەت بداتێ. ئەویش وەڵام دەداتەوە و دەڵێت: «جزاكَ اللهُ خيراً».

واتە: خوا پاداشتی بەخێرت بداتەوە. یان بڵێ: « وَرَزَقَكَ اللهُ مثله»[٤]. واتە: خوا کۆرپەیەکی واش بدات بەتۆ.

دەشتوانن جگە لەم دووعایانە، خۆتان بە کوردی چۆن دەزانن ئاوا پیرۆزبایی لێ بکەن و دووعای خێری بۆ بکەن.

بۆ زیاتر کامەران بوونی هەموو لایەك، دەشتوانن گوڵ و گوڵزاری جوان یان هەر دیاریەکی تر کە خۆتان بەباشی دەزانن، بە دیاری بۆ یان بەرن، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: «تهادوا تحابوا» واتە: دیاری بدەن بەیەك لای یەك خۆشەویست دەبن.

---

(٣) بڕوانە: (كتاب الاذكار) (ل: ٣٦٣)، دانراوی: ئیمام (النووی)

(٤) بڕوانە: (كتاب الاذكار) (ل: ٣٦٣).

**○ بانگدان بە گوێی منداڵی تازە بوو:** (ابی رافع) دەڵێت:((رأيت رسول الله ﷺ أذن في أذن الحسن بن علي حين ولدته فاطمة بالصلاة))(٥)، واتە:

---

(٥) رواه ابو داود (٥١٠٥)، والترمذي (١٥١٤)، واحمد (٢٩١،٩/٦، ٣٩٢)، والطيالسي(٢٧٣/٢)، والطبراني في الكبير (٩٣١، ٢٥٧٨ )، وفي الدعاء ( ٩٤٤ )، والحاكم (١٧٩/٣)وعبد الرزاق (٧٩٨٦)، والبيهقي في السنن الكبرى (٣٠٥/٩)، وفي الشعب (٨٦١٧، ٨٦١٨)، والبغوي في شرح السنة (٢٧٣/١١)، ومن طريقه القزويني في أخبار قزوين (١٧٩/٤) ، والروياني في المسند ( ٦٨٢ )، والبزّار في البحر الزخّار ( ٣٢٥/٩ )، وابن حبان في المجروحين ( ١٢٨/٢)، وابن أبي الدنيا في (( العيال )).

**تێبینی:** زانایان هێندێکیان دەڵێن حەدیسەکانی بانگدان بە گوێی کۆرپە(صحيح)ن، کەچی هێندێکی تریان دەڵێن: (ضعيف)ن، بەلاَم فەرموودەی قامەت کردن بە گوێی چەپی کۆرپەدا هەموو زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی (ضعيف)ـە

**(محمد بن العثيمن)** دەڵێت: فەرموودەی قامەت کردن بە گوێی چەپی کۆرپەدا(ضعيف)ـە، بەلاَم فەرموودەی بانگدان بە گوێی ڕاستی کۆرپەدا باشە ئەگەر چی هێندێ قسەشی لەسەرە. فتاوى نور على الدرب.

**(الالبانی) دەڵێت:** من پێشتر گوتبووم بانگدان بە گوێی منداڵی تازە لە دایك بوو سوونەتە، چونکە ئەو فەرموودە ڕیوایەت کراوە لە (سنن الترمذي)ی بە سەنەدێکی بێ هێز، جا لە ڕێگای بە هێز کردنی فەرموودە بەشاهیدی تر، من بۆ ئەو فەرموودە لە کتێبی (تحفه المودود في أحكام المولود)ی (ابن قيم الجوزى) شاهیدێکم بینیەوە کە ئەویش گەڕاندبوویەوە بۆ کتێبی (شعب الإيمان)ی ئیمام (بیهەقی) لەگەڵ ئەوەشدا وتبووی سەنەدەکەی بێ هێزە، بەلاَم من وام دانەنابوو کە سەنەدەکەی زۆر بێ هێزە، جا لەسەر ئەم بنەڕەتە کردمە شاهید بۆ فەموودەکەی (الترمذي)، ئەوکات کتێبی (شعب الإيمان)ئەم لەبەر دەست نەبوو نە بەچاپ نە دەسنووس تاکو لێی بڕوانم بەلاَم ئێستاکە ئەم کتێبە چاپکراوە و بلاَوبۆتەوە، ئەو فەرموودەی تیایە کە (ابن قيم الجوزى) هێنابوویەوە بە

سەنەدێك کە دوو کەسی تیایە هەر دووکیان تۆمەت بارن بە درۆ، جا لەو حاڵەتەدا ناگونجێ بۆ کەسێك کە خەریك بێت بە (علم الحدیث) فەرموودەیەکی (شدید الضعف) واتە: زۆر بێ هێز، بکات بە شاهید بۆ فەرموودەیەکی(لیس شدید الضعف) واتە: زۆر بێهێز نەبێت، بۆیە ئەوکات لە بەهێز کردنی فەرموودەکە پەشیمان بوومەوە... گەڕامەوە لەوەی بانگدان سوونەت بێ، الفتـاوی الجزائریـــة.

**پرسیاریان لە (ا. د. سلیمان العیسی)** کرد، لە وەڵامدا وتی: (جمهور)ی زانایان دەڵێن بانگدان بە گوێی ڕاستی منداڵدا سوونەتە، ئەم بۆچوونەش لە مەزهەبی (حەنەفی)و(شافعی)و(حەنبەلی) بەم شێوە ڕوون و ئاشکرایە، هێندی لە زانایانی (شافعی)و(حەنبەلی)یش دەڵێن: سوونەتە قامەتیش لە گوێی چەپدا بکرێت، هەر وەکو (ابن قیم)یش لە کتێبەکەی خۆیدا (تحفه المودود بأحكام المولود) بەشێکی بەم ناونیشانە ناوە کە دەڵێت: ((بەشی چوارەم: سوونەتە بانگدان بەگوێی ڕاستی منداڵدا و قامەت کردن بە بەگوێی چەپییدا))، هەروەها (صەنعانی)و(شەوکانی) و چەند زانای تریش دەڵێن سوونەتە، بەڵگەش بەم فەرموودە دەهێننەوە: ((أن النبي صلى الله عليه وسلم أذن في أذن الحسن والحسين حين ولدا)) هەروەها بەم فەرموودەش: ((عن الحسين بن علي رضي الله عنهما قال: قال رسول الله من وَلِدَ له مولودً ، فأذَنَ في أذنهِ اليمنى ، أقام في أذنهِ اليسرى، لم تضرُهُ)) بەم شێوەیە بەڵگە بەچەند فەرموودەیەکی تری لەم شێوە دەهێننەوە، بەڵام ئیمام (مالك) بانگ دان بەگوێی منداڵدا بە پەسند نازانێت، دەڵێت دەبێت نەکرێت.

هێندێ لە زانایانی سەردەمی شارەزا لە فەرموودەدا دەڵێن: بانگدان بەگوێی ڕاستی منداڵدا و قامەت کردن بەگوێی چەپییدا، سێ فەرموودە لەم بارەیەوە هاتووە، فەرموودەی (الحسن بن علی)، و (ابن عباس) و (عروة) کە هیچ یەکێکیان ئەوی تر بەهێز ناکات بەپێی زانستی فەرموودە.

بەڵام بانگدان بەگوێی منداڵدا فەرموودەی (ابی رافع)ی لە بارەوە هاتووە لە (مسند احمد)و(سنن ابی داود)و(الترمذي) و غەیری ئەمانیش هاتووە، بە (صحیح) دانانی (الترمذي)و(الحاکم) بۆ ئەم فەرموودە سەلیم نیە، چونکە لە سەنەدەکەیدا (عاصم بن

**کاتێك (فاطمة)ـە (الحسن)ی بوو، پێغەمبەرم ﷺ بینی بانگی ئەدا بەگوێی (الحسن)دا.**

**چەند سودێك لەم بانگ دانە هەیە لەوانە:**

- ✓ **ئەو بانگدانە یەکەم شتە کە ئەو منداڵە گوێی لێ دەبێت، کە ناوی خوای تیادایە و هەر ئەو شەهادەیەشە کە لەو بانگەدا هەیە مرۆڤ پێی دێتە ناو ئیسلام و هەر بەویش بەسەر بەرزی لە ئیسلام دەردەچێت[٦].**
- ✓ **شەیتان ئەگەر گوێی لە بانگ بێت هەڵدێت پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: «إذا نودي بالصلاة، أدبر الشيطانُ ولە ضراط حتى لا يسمع التأذين»[٧]، واتە: کاتێك شەیتان گوێی لە بانگ دەبێت بە پەلە هەڵدێ تا گوێی لە بانگەکە نەبێت[٨].**

---

عبيد الله العدوى المدنى)ی تیا هەیە کە (ضعيف)ـە، بەڵکو هێندێ لە زانایانی شارەزا لە فەرمووده دەڵێن: ئەم حەوت فەرموودانەی لەم بارەوە هاتوون یان (موضوع)ن یان (ضعيف)ن یان(آثار)ن و پچڕاون. سەرچاوە سایتی (WWW.ALMOSLIM.NET) ژمارەی پرسیار،15098.

بەڵام لە کاری چاکە دەتوانرێ کار بەم فەرموودەیە بکەین، کەواتە دەتوانین بانگ بە گوێی منداڵی لە دایك بوو بدەین.

(٦) (تحفة المودود بأحكام المولود) ابن القيم (ل:٢٢)، المرقاة، علي القاري (ب: ٨/ل:١٥٩ ).

(٧) صحيح: رواه أحمد ( ٢/ ٣١٣ ) واللفظ له، ومسلم ( ٣٨٨ ).

(٨) (تحفة المودود بأحكام المولود) ابن القيم (ل:٢٢).

✓ بانگ کردنیەتی بۆ ئاینی پاکی ئیسلام، کە ئاینی فترەتە[٩].

○ **دەم شیرین کردنی کۆرپەی تازەبوو:** سوننەتە منداڵ کاتێك دەبێت کەسێك، خورمایەك لە ناو دەمی خۆی نەرم وشل بکات، ئینجا بە خورمایەکە سەری پەنجەی چەور بکات و لە دەمی منداڵەکەی وەربدات و هەموو دەمی منداڵەکەی پێ شیرین بکات، ئەگەر خورماشی دەست نەکەوت دەتوانێ هەر شتێکی تری شیرین بەکار بێنێت، وەکو دۆشاو (ابو موسی) دەفەرمووێ:

«وُلِدَ لِي غُلاَمٌ فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ فَسَمَّاهُ إِبْرَاهِيمَ وَحَنَّكَهُ بِتَمْرَةٍ وَدَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ»[١٠].

واتە: کوڕێکمان بوو، منیش بردم بۆلای پێغەمبەر ﷺ ئەویش ناوی لێنا (ابراهیم) خورمایەکیشی لە ناو دەمی خۆیدا نەرم وشل کردەوە

---

(٩) بۆ زیاتر شارەزابوون لەم باسە بڕوانن بۆ ئەم سەرچاوانە: ((الوابل الصيب))(٢٩٣)، ((تحفة المودود بأحكام المولود))(٣٠)((تحفةالأحوذي))(٥/٩٠)((التلخيص))(٤/١٥٠١)،((كتاب الاذكار))(٣٥٩)،((إرواء الغليل ))(٤/٤٠٠-٤٠١)،و((الضعيفة))(١/٤٩٣).

بڕوانن بۆ ئەم سایتانەش:

www.sahab.ws/6559/news/5445.htmlwww.ibnothaimeen.com/all/noor/article --7005.shtml
www.islamtoday.net
www.kalemat.org

(١٠) صحيح: رواه البخاري ومسلم.

و دەمی منداڵەکەی پێ شیرین کرد و دووعای بۆ کرد کە بەرەکەت بکەوێتە ژیان و تەمەنیەوە.

**ئاگـــاداری:** هـەنگوین بـۆ ئـەم حاڵەتـە بـە کارنایـەت، نابێـت بـۆ ئـەم مەبەسـتە هـەنگوین بـە کۆرپـەی تـازە لـە دایـك بـوو بـدرێت، یـان کۆرپەکـە زەرتکـی گرتـووە هـەنگوینی پـێ بـدەن، چـونکە زانسـتی پزیشکی دەری خستووە کە هەنگوین زیان بە کۆرپەی تازە لە دایك بـوو دەگەیـەنێت تـا تەمـەنی ئـەم منداڵـە نەبێتـە سـاڵێك نابێـت هەنگوینی پێ بدرێت، لە ڕووی شەرعیشەوە هیچ دەقێك نیە بڵێت هەنگوین بە منداڵی تەمەن لە خوار ساڵێك بدەن[(١١)].

○ **سەرتـاشینی کۆرپە:** سوننەتە ڕۆژی حەوتەم لە دوای سـەربڕینی هۆزەبانەکە هەموو سەری کۆرپەکە بتاشرێت، کچ بێت یـان کـوڕ بـە بەڵگەی ئەم فەرموودەیـە: «كُلُّ غُلاَمٍ رَهِينَةٌ بِعَقِيقَتِهِ، تذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ السَّابِعِ، وَيُحْلَقُ رَأْسُهُ، وَيُسمَّى»[(١٢)].

واتـە: هـەموو کۆرپەیـەك بارمتـەی هۆزەبانەکەیـەتی، کـە لـە ڕۆژی حەوتـەمی لـە دایکبـوونی بـۆی سـەردەبڕدرێت، هـەم لـە ڕۆژی حەوتەمدا سەری دەتاشرێ و ناوی لێدەنرێ.

---

(١١) بڕوانـە: سایتی طبیب الاطفال.

(١٢) **صحيح**: ابو داود(٢٨٣٨)، والترمذی(١٥٢٧)، والنسائی(١٦٦/٧)، ابن ماجه(٣١٦٥).

ئەم سەرتاشینە سوودێکی زۆری هەیە بۆ کۆرپەی تازە لە دایک بوو، ئەو مووە پیسە نامینێ و مووی پاك دێتەوە، مووی سەری بە هێز دەكات، چەندین سوودی تریشی هەیە.

سوننەتیشە بە ئەندازەی گرانی مووە تراشراوەکە (زیو) یان قیمەتەکەی بکرێتە خێر، کە هەموو مووەکە نیو میسقالێ دەکات[١٣].

(فاطمة)ـە (خوا لێی ڕازیبێ) کاتێك(حسن)ی بوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو «يَا فَاطِمَةُ احْلِقِي رَأْسَهُ، وَتَصَدَّقِي بِوَزْنِ شَعَرِهِ فِضَّةً على المساكين»[١٤].

واتە: (فاطمة)ـە برۆ هەموو سەری بتراشە، پاشان بە کێشی گرانی مووەکەی سەری زیو بە هەژاران ببەخشە.

**تێبینی:** بەڵام دەبێت ئەو پرچ تاشینە بە لێزانی بکرێت نەوەکو سەری کۆرپەکە زیانی پێ بگات، ئەگەر سەری منداڵەکە حەوت ڕۆژ نەرم بوو با سەر تاشینەکە دوابخات بۆ ئەو کاتەی سەری منداڵەکە گونجاو دەبێ بۆ تاشین.

(١٣) بۆ ئەوەی بە جوانی بۆم ڕوون بێتەوە مووی سەری کۆرپە چەندە، هەڵسام مووی پرچی کۆرپەیەکی تراشاوم برد بۆ زێڕنگر، کە هەمووی نیو میسقال دەرچوو، میسقاڵی زیویش بە (٢٥٠٠)ی برێمەر بوو، کە نیو میسقال دەکات (١٢٥٠) تۆش بەو شێوەیە بڕ موەکە بکێشە بە کێشی زیو پارەی زیوەکە بکە بەخێر.

(١٤) **حسن**: الارواء (١١٧٥).

# ئادابی ناولێنان

## ○ کەی ناو لە کۆرپەکەت دەنێیت؟!

لە سوننەتدا هاتووە مرۆڤ لە سێ کات دەتوانێ ناو لە منداڵەکەی بنێت:

١. ناولێنانی لە ڕۆژی یەکەم.

٢. ناولێنانی لە ڕۆژی سێیەم.

٣. ناولێنانی لە ڕۆژی حەوتەم.

جگە لەم ڕۆژانە چ ڕۆژێکی تر کە پێت خۆش بێت دەتوانی ناوی لێبنێیت(١٥).

ناو لێنانی منداڵ لە ڕۆژی یەکەم سوننەتە بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە: «وُلِدَ لي الليلة غُلام فَسَمَيته بأسم أبي ابراهيم»(١٦) واتە: ئەم شەو کوڕێکم بوو ناوی ابراهیمی باوکمم لێنا.

ڕۆژی حەوتەمیش سوننەتە ناو لە منداڵەکە بنێیت بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە: «كُلُّ غُلاَمٍ رَهِينَةٌ بِعَقِيقَتِهِ، تـذْبَحُ عَنْـهُ يَـوْمَ السَّـابِعِ، وَيُحلَقُ رَأْسُهُ، وَيُسمَّى»(١٧).

(١٥) **بڕوانە**: تسمية المولود (ل:١١)، شرح العقيدة الطحاوية (ل:٥١٤).

(١٦) **صحيح**: رواه مسلم(٢٣١٥).

واتــە: هــەموو کۆرپەیــەك بارمتــەی هۆزەبانەکەیــەتی، کــە لــە ڕۆژی حەوتــەمی لــە دایکبــوونی بــۆی ســەردەبڕدرێت، هــەم لــە ڕۆژی حەوتەمدا سەری دەتاشرێ و ناوی لێدەنرێ.

جا ئەگـەر کۆرپەکـە لـە بـار چـوو ئـەوکاتیش وا چاکە نـاوی لێبنرێت، ئیمامی (النووی) دەفەرمووێ: کورپە ئەگەر لەبارچوو سوننەتە ناوی لێبنرێت[18].

**تێبینـی**: چاکتر وایە ژن و مێرد ڕێکبکەون لەسەر ناو لێنـانی منداڵەکەیان، یـان قورعـە بکـەن بـەڵام ئەگـەر ڕێکنەکـەوتن لەسـەر ناوێك، ئەوکات باوکەکـە نـاو لـە منداڵەکـە دەنـێ بـە بەڵگـەی ئـەم فـەرموودەی پێشـوو کـە پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: ((ئـەم شـەو کـوڕێکم بـوو نـاوی پێغەمبـەر ابراهیمـی بـاوکمم لێنـا)) لێـرەدا دەردەکەوێت کە پێغەمبەر ﷺ ناوی لێناوە[19].

(١٧) **صحيح**: ابو داود(٢٨٣٨)، والترمذی(١٥٢٧)، والنسائی(٧/١٦٦)، ابن ماجه(٣١٦٥).

(١٨) بڕوانـە: (کتاب الاذکار) (ل: ٤٥٢).

(١٩) بڕوانـە: صحيح فقه السنة(ب:٢/ل:٢٢١)، و تربية الاولاد (ب:١/ل:٧١).

## ● مەرجی ناولێنان:

**لەسەر باوك ودایك پێویستە ناوێكی شەرعی و جوان وخۆش لە منداڵەکەیان بنێن، ئەم مەرجانەی تیا بێتە جێ:**

**یەکەم: ئەو وشەی دەکرێت بە ناو هەر زمانێك بێت[20] پێویستە مانای هەبێت و گونجاوبێت بۆ ناو، چونکە زۆر وشە هەیە**

---

(٢٠) شیخ (ابو زید) لە کتێبی **(تسمية المولود) (ل:٢٠)دا** دەڵێت: **(التسمي بالأسماء الأعجمية، تركية، أو فارسية أو بربرية أو غيرها مما لا تتسع لغة العرب ولسانها، ومنها : ناريمان، شادي - بمعنى القرد عندهم- جيهان)**، واتە: ناولێنانی منداڵ بە ناوی جگە لە عەرەبی جائز نیە، وەکو ناوی تورکی یان فارسی یان بەربەری یان هەر زمانێکی تر، کە جێگایان نابێتەوە لە زمانی عەرەبی، وەك ناوی (نەریمان، شادی -کە لە زمانی ئەوان بەمانای مەیموون دێت- جیهان... هتد).

شێخ(ابو مالك)یش لە کتێبی **(صحيح فقه السنة)دا** لە **(ب:٣/ل:٢٢١-٢٢٢)**، هەمان وتە دووپات دەکاتەوە کە هەر لە کتێبەکەی شێخ(ابو زید) نەقل دەکات و دەڵێت: **(لا يجوز: التسمي بالأسماء الأعجمية، كالتركية، أو الفارسية مما لا تتسع لغة العرب مثل: ناريمان – جيهان...الخ).**

بەڕێزان ئەو قسەی ئەم دوو بەڕێزە کە دەڵێن: (ناوی جگە لە عەرەبی جائز نیە) لە ڕوانگەی شەریعەتەوە هیچ ئەصڵی نیە، بەڵکو ناو ئەگەر تەنها لە بازنەی عەرەبی کۆبێتەوە ئەوە دەکاتە دەمارگیری، چونکە دەبینین پێغەمبەرﷺ زۆر ناوی عەرەبیشی گۆڕیوە کە مانایان نە شیاو بووە.. ئەگەر بڕوانین ناوی پێغەمبەران تەنها چواریان عەرەبیە ئەوەکانی تر هەمووی غەیری عەرەبیە(آدم وصالح وشعیب ومحمد) ئەم چوارە عەربیە، بەلام ناوەکانی تر هەمووی غەیرە عەرەبیە. **(تسمية المولود) (ل:١٥).**

کەوابوو: ناوی پەسەند ئەوەیە کە پڕمانا بێت و لەسەر زمان ئاسان بێت و ناوێکی خۆش بێت، جا عەرەبی بێت یان کوردی یان تورکی یان فارسی...هتد.

ماناشی هەیە، بەلاّم ناگونجیٚ بۆ ناو لەبەر ئەوەی مایەی ناخۆشی و نەگبەتی و پەژارەیی پیٚوەیە وەك: (غەمگین، زامدار، دلّتەنگ).

دووەم: چەند کرا با پیتی کەم بێت تاکو لەسەر زمان ئاسان بێت بە ئاسانی نوتقی پیٚبکریٚت.

سیٚیەم: نابیٚت ناوەکە ناوی حەیوانات بیٚت.. یان ناوی هەلّپەرکیٚ و گۆرانی بیٚت.. یان گالّتەجاڕی پیٚوە دیاربیٚت.. یان ناوی کافر و زالّمان بیٚت.

**○ ئەو ناوانەی پەسەندن و جائزن:**

۱. ناولیٚنان بە ناوی (عبدالله) و(عبدالرحمن)کە خۆشترین ناون لە لای خوای گەورە.

۲. ناولیٚنان بە ناوە جوانەکانی خوا کە (عبد)ی پیٚوە بلکیٚنریٚ، وەکو: (عبدالعزیز) و(عبدالملك) و(عبدالرحمن) و(عبد البارئ) هتد...[21].

---

شیخ(ابو زید) بەبیٚ ئاگا دەلّیٚت: (ناوی -شادی- بە مانای مەیموون دیٚت)، ئەمە وانیە بەلّکو (شادی) بە عەرەبی واتە: (سعاد)، کە شیخ(ابو زید) لە کوتایی کتیٚبەکەی خویدا (تسمیە المولود) کۆمەلّە ناویٚکی هیٚناوەتەوە یەکیان (سعاد)ـە.

(۲۱) بەلاّم هیٚندیٚ لە خەلّکی (عبد) دەلکیٚنن بە هیٚندیٚ ناوەوە، وادەزانن ناوی خوایە، کەچی ناوی خوا نیە بۆیە جائز نیە، وەکو: (عبد المقصود) و (عبد الموجود) و(عبد المعبود).

٣. ناولێنـــان بـــە نـــاوی پێغەمبەرانـــەوە، بـــە بەڵگـــەی ئـــەم فەموودەیە: «وُلِدَ لي الليلة غُلام فَسَمَيته بأسم أبي ابراهيم»[٢٢]، واتـە: ئەم شەو کوڕێکم بوو ناوی ابراهیمی باوکمم لێنا.

٤. ناولێنـــان بـــە نـــاوی پیاوچـــاکان لەســـەروی هـــەموویان هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ.

## ● ئەو ناوانەی نا پەسندن و جائز نین؛

١. هەر ناوێك جگە لە ناوی خوا کە (عبد)ی پێوە بلکێنرێ، وەکو: (عبدالرسول)و(عبدالنبی)و(عبدالعزی)و(عبدالکعبە)و(عبد الشمس) و(عبدالحارث)... هتد.

٢. ناولێنان بەو ناوانەی کە تایبەتە بە خوا و ناکرێت مرۆڤ بـەو ناوانـە نـاو لـە خـۆی بنێـت وەك: (الـرحمن)، (الـرحیم)، (الخالق)، (الباریٔ)...هتد.

٣. ناولێنـان بـەناوی بتـەوە وەك:(الـلات) و(العـزی) و(إسـاف) و(نائلە) و(هبل)... هتد.

٤. ناولێنان بە ناوی حەیوانات[٢٣].

---

(٢٢) **صحیح**؛ رواه مسلم(٢٣١٥).

(٢٣) بەڵام ناوی هێندێ حەیوانات هەیە پەسەندە، چونکە مەدحی تیایە، وەکو: (أسد، واتە: شێر)، (غزال،واتە: ناسك)، جا بزانە ناوەکە مەرجی شەرعی لێ دێتە جێ یان نا؟!

٥. ناولێنان بە ناوی هەڵپەرکێ و گۆرانی.
٦. ناولێنان بە ناوێك کە گاڵتەجاڕی پێوە دیاربێت.
٧. ناولێنان بە ناوی بێمانا و بێ سوود.

**○ ئایا دروستە ناو بردنی مرۆڤ بە ناوی خوا؟**

ئەو پرسیارە زۆر جار دەکرێت، ئایا دەتوانرێت مرۆڤ بە ناوێك بانگ بکرێت لە کاتێکا ئەو ناوە ناوی خوای گەورە بێت هیچ (عبد)یشی بە پێشەوە نەبێت[٢٤]؟

زانایان دەفەرموون: هێندێ ناوی خوا هەیە ناکرێت بۆ مرۆڤ بەکاربێت، چونکە تەنها تایبەتە بە خوای گەورە و ناگونجێت بۆ مرۆڤ بە کاربێت وەك ناوی: القيوم والأول والآخر والباطن والأحد والصمد والخالق والرازق... هتد.

ئەم ناوانە و چەند ناوێکی تریش هەن تایبەتن تەنها بە خوای گەورە و ناگونجێت بۆ مرۆڤ بە کاربێت.

بەڵام هێندێ ناو هەیە دەتوانرێت مرۆڤی پێ ناو ببرێت، ئەو ناوانەش ئەوانەن کە ماناکەی موشتەرەکە، واتە: ماناکەی تایبەت نیە تەنها بە خوا وەك ناوی: علي ولطيف وبديع وعزيز وحليم

(٢٤) بڕوانە: (فتاوى اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء والدعوة والإرشاد) فتوى رقم ١٨٦٥او تاريخ ١٤٠٩/٣/٣٠هـ، کتێبی: تحفة المودود (ل:٩٨)، شرح العقيدة الطحاوية (ل:٥١)، تسمية المولود (ل:١١). سایتی: کشف الشبهات، سایتی: شيخ محمد صالح المنجد (www.islam-qa.com)،

وملك.. چەند ناوێکی تریش، چونکە خوای گەورە لە قورئاندا بەم ناوانە ناوی بەندەکانی هێناوە: ﴿نبَشِّرُكَ بِغُلامٍ عَلِيمٍ﴾(الحجر:٥٣)، ﴿فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ﴾(الصافات:١٠١)، ﴿قَالَتِ امْرَأَةُ الْعَزِيزِ﴾(يوسف:٥١)، ﴿وَكَانَ وَرَاءَهُمْ مَلِكٌ﴾ (الكهف:٧٩)[٢٥].

## ○ بانگکردنی کەسێك کە ناوی نازانی:

ئەگەر ویستت بانگی کەسێك بکەیت و ناویشیت نەزانی، ئەوە سوننەتە بە ناوێك بانگی بکەیت کە ئەزیەتی پێ نەخوات وەك: مامۆستا یان برام یان کاکە یان بەڕێز یان خوشکە یان خاتوون یان کاکی شوفێر یان کاکی جل شین... هتد.

## ○ ئەو کەسانەی نا پەسندە بە ناوی خۆیان بانگیان بکرێت:

نا پەسندە بانگ کردنی باوکت یان دایکت یان مامۆستاکەت یان پیاوی بە تەمەن بە ناوی خۆیان، پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی منداڵێکی لەگەڵدابوو بە منداڵەکەی فەرموو: ئەم کابرایەی لەگەڵت دایە کێیە؟ منداڵەکە وتی: باوکمە، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: کەواتە لە پێشی مەڕۆ، تووڕەی مەکە تا جنێوت پێنەدات، لەبەر دەمی دامەنیشە، بە ناوی خۆشی بانگی مەکە[٢٦].

---

(٢٥) **بڕوانە**: ناوە جوانەکانی خوا، (ل:٢٩) نووسینی دانەر.

(٢٦) رواه ابن السني رقم (٣٩٥) وللحديث شواهد بمعناه ذكرها الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) ١٣٧/٨.

بەڵکو دەبێت باوکت بە بابە یان باوکە بانگ بکەیت، مامۆستاکەشت بە مامۆستا یان شێخ یان (استاذ) بانگ بکەی ئەگەرچی تەمەنیشی لە تۆ بچوکتریش بێت، پیاوی بەتەمەنیش بە مامە یان خاڵە بانگ بکە.

**○ بانگکردنی کەسێك بە ناوێك کە پێی ناخۆشە:**

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ﴾(الحجرات:(١١)، واتە: سووکایەتی بەکەس مەکەن بەلەقەب وناوو و ناتۆرەی ناشیرین.

ئیمامی (النووی) لە (کتاب الاذکار)دا دەفەرموێت: زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی حەرامە بانگی کەسێك بکەی بە ناوێك کە پێی ناخۆشە، جا ئەمە سیفەتی بێت یان نا فەرقی نیە وەك: (کوێرە)، (کەچەڵ)، (شەلە)، (خێلە)، (گرووو)... هتد. بەڵام زانایان فەرموویانە: ئەگەر خەڵکی نەیناسینەوە بۆ ناسینەوەی دروستە عەیب و لەکەکەی بڵێیت[٢٧].

**○ بانگکردنی کەسێك بە لەقەبێك کە پێی خۆشە:**

لەقەب: بریتیە لەو نازناوەی کە مرۆڤ پێی دەناسرێت: وەکو: (الجوزی) کە لەقەبی (ابن قیم الجوزی)ـە، هەر کەسێك

(٢٧) بڕوانە: (کتاب الاذکار) (ل: ٣٦٨).

لەقەبێکی پێ خۆش بوو، سوننەتە بەو لەقەبە بانگی بکەی بە مەرجێك لەقەبەکە شەرعی بێت، لە (صحیح البخاری)دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ (الخِرباق)ی بانگ دەکرد بە (ذو الیدین)[٢٨].

**o کورت کردنەوەی ناو:**

سوننەتە بۆ خۆشەویستی ناو کورت بکرێتەوە، ئەگەر ناوەکەی پێ ناشیرین نەبێت، بە بەڵگەی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە ناوی چەند هاوەڵێکی کورت کردبۆوە، کە بە (ابی هریرة)ی دەفەرموو: (ابا هر)، بە (عائیشة)شی دەفەرموو: (عائش)، بە(انجشة)شی دەفەرموو: (انجش).

بەڵام هێندی ناو هەیە بە کورت کردنەوە ناشرین دەبێت و خاوەنەکەشی پێی ناخۆش دەبێت، بە تایبەت هێندی ناوی کوردی هەیە بە کورت کردنەوە تێك دەچێت و ناشرین دەبێت.

**o کونیە بە ناوی منداڵی گەورە:**

**کونیە:** واتە، دانانی (اب=باوك) یان (أم=دایك) لە پێش ناوێکەوە، وەکو: (ابو احمد)، (ام احمد). سوننەتە کونیەکەی بە ناوی منداڵە گەورەکەی بکات، پێغەمبەر ﷺ کونیەی خۆی بە ناوی کوڕی گەورەی (ابو القاسم)نابوو. هەروەها پێغەمبەر ﷺ

کونیەی (ابو شریح)یشی بە ناوی کوڕە گەورەکەی هاوەڵێکی نا کە ناوی (شریح)بوو[٢٩].

### ○ کونیە بۆ کەسێك کە منداڵی نیە:

مەرج نیە کەسێك منداڵی هەبێت یان ژنی هێنابێت یان گەورە بێت ئینجا کونیەی هەبێت. بەڵکو کۆمەڵێك لە هاوەڵان بێ ئەوەی منداڵیشیان هەبێت کونیەیان هەبووە، وەکو: (ابو هریرة) و(ابی حمزة) و چەند هاوەڵێکی تریش کە لە ژمارە نایەن.

(انس) دەڵێت: برایەکی بچوکم هەبوو، پێغەمبەر ﷺ هەر جارێك هاتبا بۆ لای، پێی دەفەرموو: (ابو عمیر) چیت لە (نغیر)کرد دەبینین بەو منداڵەی فەرمووە (أبو عمیر)[٣٠].

### ○ گۆڕینی ناوی ناشیاو:

پێویستە ئەو ناوانەی کە ناشیاو و ناشیرینن بگۆردرێن، بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە: (أنَّ النبي ﷺ غيَّر اسم عاصية وقال: أنتِ جميلة)[٣١]، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی (عاصیة) واتە: یاخی، گۆڕی وپێی فەرموو: لەمەودوا تۆ ناوت (جمیلة)یە، واتە: جوان.

---

(٢٩) بڕوانە: (کتاب الاذکار)(ل: ٣٧٠).

(٣٠) **صحيح**: رواه البخارى رقم (٦١٢٩)، و مسلم رقم (٢١٥٠).

(٣١) **صحيح**: مسلم رقم (٢١٣٩)، والترمذى رقم (٢٨٤٠)، وابو داود رقم (٤٩٥٢).

# خەتەنەکردن

○ **مێـژووی خەتەنـەکردن:** لـە ڕاسـتیدا ئیسـلام خەتەنـەکردنی دانـەهێناوە، بـەڵکو نـەریتێکی بـاوو کـۆن بـووە لـە نێـو گـەلانی کۆنەوە هەبووە.

(هـیرۆدۆت) مێژوونووسـی ئیغریقـی بـەناوبانگ دەڵێـت: ئەوانـەی لـە سـەردەمانی زۆر کـۆن خەتەنـەیان ئـەنجام داوە میسریەکان و ئاشوریەکان و کۆسیدیۆن و حەبەشیەکان بوونـە، گەلانی دیکەش لە میسریەکانەوە فێربوونە[٣٢].

(شـێخ مـەحمود شـەلتوت) شـێخی پێشـووتری ئەزهـەر، دەڵێت: کرداری خەتەنەکردن کردارێکی کۆنە، هەر لە سـەرەتای مێـژووەوە زۆر خـەڵك ئـەو کارەیـان کـردووەو، تـا هـاتنی ئیسلامیش لەسەری بەردەوام بوونە[٣٣].

چەند پارچە لەوحەیەك دۆزراوەتەوە مێژووەکەی دەگەڕێتـەوە بـۆ بابلیـەکان وسـۆمەڕیەکان بـە ڕوونـی باسـی چـونیەتی خەتەنەکردن دەکات.

---

(٣٢) بڕوانـە: تأريخ الحضارة المصرية القديمة ٥٣٢/١.

(٣٣) الفتاوي/ ٢٣٠-٢٣١، لێژنەی باڵای فەتوای کوردستان.

هەروەها پارچە لەوحەیەك لە گۆڕی (عنخ آمون) دۆزراوەتەوە باسی چۆنیەتی خەتەنە دەكات لەلای فیرعەونیەكان[٣٤].

ئەوەی لێرەدا بۆ ئێمە گرنگە ئەوەیە، کە عەرەب پێش هاتنی ئیسلامیش خەتەنەکردنیان ناسیوە، بۆ پیاوو ئافرەت ئەنجامیان داوە، ئەوەندە باو بووە لە نێویان تا بووەتە نەریتێکی خوو پێگیراو[٣٥].

## ○ پێناسەی خەتەنە:

**خەتەنەی کوڕ:** بریتیە لە بڕین و لێکردنەوەی ئەو پارچە گۆشتەی کە سەر ئامێری میزکردنی نێرینەی داپۆشیوە.

**خەتەنەی کچ:** بریتیە لە بڕین و لێکردنەوەی کەمێك لەو گۆشتەی کە سەر کونی میزکردنی مێینەی داپۆشیوە.

## ○ حوکمی خەتەنەکردن:

**ڕای یەکەم:** خەتەنەکردن بۆ پیاو و ئافرەت بە واجب دادەنێن. ئەمە ڕای زۆرینەی شافیعیەکان[٣٦] و حەنبەلیەکانە،

---

(٣٤) الختان بين موازين الطب والشريعة، الدكتور الطبيب محمد نزار الدقر.

(٣٥) لێژنەی باڵای فەتوای کوردستان.

(٣٦) مغني المحتاج ٤/٢٠٢. نهاية المحتاج ٧/١٨٤.

**ئەمە ڕای ئەو زانایانەشە (الشعبی) و (ربیعە) و (الأوزاعي) و (یحیی بن سعد الأنصاري)[٣٧].**

**ڕای دووەم: خەتەنەکردن بۆ پیاوان و ئافرەتان سوننەتە[٣٨]، ئەمە ڕای ئەبو حەنیفە و ریوایەتێکی ئیمامی مالیك و هەندێك لە هاوەڵانی شافعیو حەسەنی بەسریە[٣٩].**

---

(٣٧) الأنصاف ١٢٢/١ ، كشاف القناع ٨٣/١ ، حاشية الروض المربع ١٥٩/١ ، المجموع ٤٩٢/٣.

(٣٨)زانایانی (حنفی) و هێندێ زانای (مالکی) و لە ڕیوایەتێکی ئیمام (احمد)یشدا هاتووە کە خەتەنەکردنی کوڕان سوونەتە نەك واجب، بەلام لە سوننەتی (فطرة)یە و دروشمی ئیسلامە، ئەگەر لە شارێکدا هەموو وازیان لە خەتەنەکردن هێنا، ئەوە پێویستە پێشەوای بڕواداران جەنگیان لەگەڵدابکات، هەر وەکو چۆن ئەگەر لە شارێکدا هەمووی وازیان لە بانگدان هێنا ئەوە پێویستە جەنگیان لەگەڵدابکرێت، خەتەنەکردن یەکێکە لەو دروشمانەی کە موسلمان لە خەڵکی تر پێی جیا دەکرێتەوە، هەر بۆیەش دەبینین موسلمانان لە هەموو شوێنێکدا کوڕان خەتەنە دەکەن و کەمتەرخەمیی تیاناکەن.

**(د.یوسف القرضاوی)** دەڵێت: بەلام ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت واجبە ئەمە گرانە لەسەر ئەوانەی تازە موسلمان دەبن. یەکەم جار کە چوومە (إندونیسیا) وەزیری ئەوقافی ئەوەی پێی ڕاگەیاندم کە یەکێ لە هۆزەکانی (إندونیسیا) ویستیان موسلمان بن، جا سەرۆك هۆزەکەیان هات بۆلای هێندێ لە زانایانی موسڵمانی (إندونیسیا) تاکو بزانن کە موسڵمان بوون چیان لێ داوا دەکرێت، زاناکانیش وتیان دەبێت هەمووتان خەتەنەبکرێن، جا کاتێك ئەمەیان بیست لەم نەشتەرگەریە بەکۆمەڵە ترسان، هەر بۆیە موسڵمان نەبوون و لەسەر بتپەرستی خۆیان مانەوە. چونکە مەزهەبی زانایانی (إندونیسیا) شافعیە کە لەم بارەیەوە زۆر توندە بە جۆرێك کە خەتەنەکردن بە واجب دەزانێت، سایتی: (*www. islamonline.net*).

(٣٩) المغني والشرح الكبير ٧٠/١. فتح القدير ٤٥/٦.

**ڕای سێیەم:** خەتەنەکردن بۆ پیاوان واجبە، بۆ ئافرەتانیش سوننەت و مەکرەمەیە. ئەوە ڕای ئیمامی ئەحمەدە، (ابن قدامە) و (ابن عثیمین) لیژنەی فەتوای سعودیاش ئەو ڕایەی هەڵبژاردووە[٤٠].

**○ هیچ فەرموودەیەکی (صحیح) لەسەر خەتەنەی کچ نیە:**

هیچ فەرموودەیەکی (صحیح) نەهاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمان بکات بە خەتەنە کردنی کچان، بەڵام ئافرەتێک هەبووە لە مەدینە پێغەمبەر ﷺ ڕێنمایی کردووە ئەگەر خەتەنەی کچان دەکات بە ڕێکی بیکات، پێی فەرمووە: ((لا تنهكي!! فإن ذلك أحظى للمرأة وأحب للبعل))[٤١].

واتە: لە خەتەنەکردن دا ئاگادار بە زۆری مەبڕە، چونکە باشترین خۆشی و چێژ وەرگری ئافرەتە و بۆ پیاویش واتە(مێرد) خۆشتر و باشترە.

هەروەها لە فەرموودەیەکی تر هاتووە بە گشتی باسی خەتەنە دەکات کە دەفەرمووێ:(( الفطرة خمس أوخمس من الفطرة، الختان، والإستحداد، ونتف الإبط، وتقليم الأظفار، وقص الشارب))[٤٢]، واتە:

---

(٤٠) الأنصاف ١/١٢٤، الضروع لابن مفلح ١/٣٢، المغني ١/١١٥ ، فتح الباري ١٠/٢٥٣، فتاوي اللجنة الدائمة ٥/١١٣، المختارات الجلية ص ١٦، الشرح الممتع ١/١٣٢.

(٤١) رواه أبو داود وسنده صحيح.

(٤٢) رواه البخاري ومسلم.

پێنج خەسڵەت هەیە کە بنەڕەتی پاك وخاوێنین بۆ مرۆڤ خەتەنە، لابردنی تووکەبەر، هەڵکێشانی مووی بن باخەڵ، قرتاندنی نینۆك، بەرسمێڵ کردن تادەرکەوتنی سوورایی لێو.

**ئەو دوو فەرموودەیە بەڵگە نین لەسەر خەتەنەکردنی کچان:**

ئەو فەرموودانەش پەیوەستن بە خەتەنەکردنی مێینە زۆربەیان فەرموودەی لاوازن، ئەبو داود لەو بارەوە دەفەرمووێ: "فەرموودەی خەتەنەکردنی ئافرەت بە چەند شێواز گێڕدراوەتەوە، هەموویان لاواز و مەعلولن و ناکرێنە بەڵگە"[٤٣].

ئیمامی مەناوی لە کتێبی (**فیض القدیر**)دا لەگەڵ خاوەنی کتێبی (**نیل الاوطار**) لە ئیبن مونزیرەوە دەگێڕنەوە، دەفەرمووێ: لە بارەی خەتەنەوە هیچ فەموودەیەك نیە پشتی پێ ببەسترێت، هیچ سوننەتێکیش نیە کاری پێ بکرێ"[٤٤].

(**د.یوسف القرضاوی**) دەڵێت: ئەوەی من لەم بارەیەوە بە ڕاستی دادەنێم ئەوەیە: خەتەنەکردنی ئافرەت نە واجبە نە سوننەتە، بەڵکو (مباح)ـە واتە: ڕێگە پێدراوە، بەمەرجێك کە کەمێکی لێ ببڕێ نەك زۆر، شتی (مباح)یش ئەگەر زیانی هەبوو

---

(٤٣) عون المعبود شرح سنن أبي داود ٧/١٢٦.

(٤٤) لێژنەی باڵای فەتوای کوردستان.

دەکرێت نەیکەی هەر وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لا ضرر ولا ضرار))، واتە: نابێت نە زیان لە خۆت بدەیت، نە لەخەڵکیشی بدەیت.

کەوابوو ئەگەر زانایانی شارەزا لەم بوارە دڵنیا بوون، خەتەنەکردنی ئافرەت زیانی هەیە، ئەوە دەبێت ئەنجام نەدرێت، تاکو زیان بەکەس نەگات، بەڵام ئەگەر شارەزایان وتیان: سوود بەخشە ئەوکات پێویستە پەیڕەو بکرێت[٤٥].

لە پرسیارێکی سایتی (www.islam-qa.com) کە شێخ (محمد صالح المنجد) وەڵامی دەداوەتەوە و دەڵێت: چاك وایە ڕەچاوی بەرژەوەندی ئافرەتەکە بکرێت، ئەگەر ئافرەت لە شوێنێکی گەرم دەژیا کە میتکە تیادا زۆر گەشە دەکات، ئەوکات کەمێکی لێدەکرێتەوە، ئەگەر نا نابڕێت، چونکە لە شوێنی گەرم لەگەڵ شوێنی سارد جیایە -لەبەر ئەوەی لە شوێنە گەرمەکاندا میتکە گەشە دەکات و ئارەزووی جنسی ئافرەت بە شێوەیەکی نا سروشتی زیاد دەکات، کە لەوانەیە بەرەو لاڕێی ببات، بەڵام لە وڵاتە ساردەکان وانیە- فەرموودەیەکیش لە بارەی خەتەنەکردنی ئافرەتەوە هاتووە:

(٤٥) سایتی: (www.islamonline.net).

(( الختـان سـنّة للرجـال، مكرمـة للنسـاء )) بـەڵام زانایـان ئیختلافیـان هەیـە ئایـا (صحیح)ـە یـان (ضـعیف)ـە بڕوانـە: (سلسلة الأحاديث الضعيفة للألباني رقم ١٩٣٥)[٤٦].

**پوختـەی قسـە ئەوەیـە:** چـونکە هـیچ بەڵگەیـەکی (صـحیح) نـەهاتووە لـە بـارەی خەتەنـەکردنی کچـان، دەبێـت بەرژەوەنـدی ئافرەتەکە ڕەچاو بکرێت، ئەویش پزیشکی پسپۆڕ لەو بارەیـەوە بڕیار دەدات ئایا خەتەنە بکرێت یان نا!؟

- **سوودی خەتەنەکردنی کوڕان:**

لە بارەی خەتەنە کردن، لە کتێبی (حیاتنا الجنسیە)ی دکتـۆر صـبری القبـانی دا هـاتووە: خەتەنـەکردن کـارێکی تەندروسـتی زۆر چـاك و بـەرزە، خاوەنەکـەی لـە زۆر دەرد و نەخۆشـی دەپارێزێ، خەتەنەکردن چەند سودێکی هەیە کەئەمانەن:-

١. بە بـڕینی قوڵفـەی سـەری چـوك(زەکەر)، خاوەنەکـەی لـەو مـاددە ڕۆنـی و چـەوری یـە ڕزگـاری دەبـێ، کـە لـەم شـوێنەوە دەردەچێ، هەروەها لەو ئاوە چەوریانە ڕزگاری دەبێ.

٢. بـە بـڕینی قوڵفـەی سـەری چـوك مـرۆڤ ڕزگـاری دەبـێ لـە مەترسی نەکشانی چوك.

(٤٦) سایتی: پرسیاری (427).

٣. خەتەنە کردن دوچاربون بە نەخۆشی شێرپەنجە (سرطان) کەم دەکاتەوە، ئەوەش لە ناو ئەو گەلانەی دروشمەکانی دین بە جێ دەهێنن زۆر کەمە.

٤. ئەگەر پەلە بکەین لە خەتەنە کردنی منداڵ، ئەوا دەتوانرێ دور بخرێتەوە لە توش بونی میزەچڕکەی شەو، یان میز بە خۆ داکردن. زۆربەی منداڵ، کە لەسەر جێگاکەی میز بەخۆیدا دەکات بەهۆی پێچەوانەیی دەمارەوەیە، کە سەرچاوەکەی قوڵفەی چوکەکەیە، کە لە پێستی خوارەوەی بە درێژی دەمێنێتەوە.

٥. بە خەتەنەکردنی منداڵ مەترسی زۆر کردنی (العادة السرية) واتە: ئاوهێنانەوە بە دەست، کەم دەکاتەوە چونکە بونی قوڵفە و ماددەی چەوری، دەمارەکانی دەورەی چوک دەبزوێنێ، وا لە هەرزەکار(مراهق) دەکات، کە بیخورێنێ و زیاد لە پێویست گەمەی پێ بکات.

٦. خەتەنە کردن کاریگەرییەکی ناڕاستەوخۆی هەیە لەسەر بەهێزی ئارەزوی جنسی، چونکە لە هەندێك ڕێنمایی زانستیدا دەرکەوتووە، کە سەرژمێریان کردوە ئەو کەسانەی

خەتەنەکراون، ماوەی جووتبوونیان پێش پەڕین درێژە دەخایەنێ، زیاتر لەو کەسانەی خەتەنە نەکراون، لەبەر ئەوە ئەوانە زیاتر چێژ و خۆشی لەمە وەردەگرن و زیاتریش چێژ و خۆشی بە ژن دەدات[٤٧].

توێژینەوەکان دەریانخستووە کە خەتەنەکردنی کوڕان ڕێژەی تووشبوون بە ڤایرۆسی (ئەیدن) بە ڕێژەی (٪ ٦٠) کەم دەکاتەوە.

دوای ئەوەی بە شێوەیەکی زانستی ڕوون بۆوە کە خەتەنەکردن یارمەتی نەهێشتن و تووشنەبوون بە نەخۆشی (ئەیدن) دەدات، شارەزایانی بواری تەندروستی لە خوارووی ئەفریقا داوایان کرد کە بەرنامەیەك بۆ خەتەنەکردنی بە کۆمەڵ پیادە بکرێت، ئەوی دوای ئەوەی توێژینەوەکان دەریانخستووە کە خەتەنەکردنی کوڕان ڕێژەی تووشبوون بە ڤایرۆسی (ئەیدن) بە ڕێژەی (٪٦٠) کەم دەکاتەوە.

پرۆفیسۆر (ئالن وایتساید) دەڵێت: هەر منداڵێك کە لە نەخۆشخانە گشتییەکاندا لەدایك دەبێت، دەبێت خەتەنە بکرێت.

(٤٧) سایتی بەهەشت.

هەروەها لە میانەی کۆنگرەی نیشتیمانی بۆ نەهێشتنی (ئەیدن) وتی: بەڵگەی بڕاوە و دڵنیابەخش هەیە کە دووپاتی پێویستی خەتەنەکردن دەکەنەوە.

لە هەر نۆ کەسێك لە ئەفریقـای خواروو، یەکێك تووشبووی ڤایرۆسی (ئەیدن)ـە کە دەکاتە نزیکەی پێنج ملیۆن و نیو لە دانیشتووانی ئەو وڵاتە، کە دووەم ڕێژەی تووشبوونە پاش هیندستان.

(نیل مارتنسۆن) ئەندامی یەکەی لێکۆڵینەوە بۆ تووشبوونی (ئەیدن) پێش لەدایکبوون دەڵێت: ڕێژەیەکی زۆر لە پیاوان و ژنانی خوارووی ئەفریقـا بیرۆکەی خەتەنەیان پێ قەبووڵە و بەباشی دەزانن[٤٨].

### ● کەی منداڵ خەتەنە دەکرێت:

هێندێ لە زانایان دەڵێن: کاتی خەتەنەکرنی منداڵ دوای بالغ بوونیەتی، هێندێ زانای تریش دەڵێن: واباشە لە تەمەنی دە یان حەوتساڵی خەتەنە بکرێت، بەڵام ئەو بۆچونەی ڕاست و دروستە ئەوەیە کە سەرپەرشتیاری منداڵەکە کەی بە چاك زانی بۆ منداڵەکە با ئەوکاتی خەتەنەی بکات.

(٤٨) بڕوانە سایتی : (*www. islamonline.net*).

# (عقیقـة) هۆزەبانە

- (عقیقـــه) هۆزەبانـــە: بریتیـە لـە کوشـتنەوەی ئاژەڵێـك لـە خۆشـی لـە دایـك بـوونی ئـەو منداڵـەی خـوای گـەورە پێـی بەخشیون، جا کوڕ بێ یان کچ.
- حـوکمی هۆزەبانــە: زانایـان سـێ بۆچـوونیان هەیـە لـەم بارەیەوە:

١. واجبە.

٢. سوننەتە.

٣. شەرعیەتی نیە [٤٩].

بەڵام بۆچوونی ڕاست ئەوەیە کە سوننەتە ئەمەش بۆچوونی جمهوری زانایانە [٥٠].

**ئایـا هۆزەبانـە بـۆ کـوڕ و کـچ وەك یەکـە؟** وا سـوننەتە بـۆ کـوڕ دوو ئاژەڵ بکرێت بە هۆزەبانە بۆ کچیش یەك ئاژەڵ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((عَنِ الْغُلاَمِ شَاتَانِ مُكَافِئَتَانِ وَعَنِ الْجَارِيَةِ شَاةٌ)) [٥١]، واتە:

---

(٤٩) تربية الأولاد (ب:١/ل:٧٤) د. عبدالله علوان.

(٥٠) ( فتاوى اللجنة الدائمة)(٤٣٩/١١)، تربية الأولاد (ب:١/ل:٧٦)، الأدلة الرضية (ل:٢٧٠)، صحيح فقه السنة(ب:٣/ل:٢٢٠)، سایتی: www.islam.qa.com

(٥١) الترمذي(١٥١٣)، احمد(٣١/٦)، وصححه الالباني (الارواء)(١١٦٦).

بۆ كوڕ دوو ئاژەڵ سەردەبڕدرێت و دەكرێتە هۆزەبانە بۆ كچيش يەك ئاژەڵ.

**تێبينى:** يەك ئاژەڵيش دروستە بكرێت بە هۆزەبانە بۆ كوڕ بە بەڵگەى ئەو حەديسە كە پێغەمبەر ﷺ «عَقَّ عن الحسن والحسين كبشاً كبشاً»[٥٢]، واتە: بۆ (حسن) و(حسين) يەكى بەرانێكى بۆ كردن بە هۆزەبانە.

○ **كاتى هۆزەبانە:** سوننەتە لە ڕۆژى حەوتەمى لە دايك بوونى منداڵەكە هۆزەبانەى بۆ بكرێت، بەڵام ئەگەر نەكرا ئەوە لە ڕۆژى چواردەهەم بيكات، ئەگەر نەكرا با لە ڕۆژى بيست و يەكەم بيكات، ئەگەر نەكرا دواى ئەم ڕۆژانە با بيكات، بەڵام پێشى بخات خێرتر و چاكترە[٥٣]، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویْ: «الْعَقِيقَةُ تُذْبَحُ لِسَبْعٍ، او َلأَرْبَعَ عَشْرَةَ، او َلإِحْدَى وَعِشْرِينَ»[٥٤]، واتە: هۆزەبانە لە ڕۆژى حەوتەم، يان لە ڕۆژى چواردەهەم، يان لە ڕۆژى بيست و يەك سەردەبڕدرێت.

---

(٥٢) أخرجه أبو داود (٢٨٤١)، وصححه الألباني في صحيح أبي داود.

(٥٣) (فتاوى اللجنة الدائمة) (٤٣٩/١١)، الوجيز(ل/٤٠٨)، تربية الاولاد(ب:١/ل:٧٦)، فقه السنة(ب:٢/ل:٣٢).

(٥٤) **صحيح:** صحيح جامع الصغير(٤١٣٢)، البيهقى(٩/٣٠٣).

○ **هەژار کە توانای نیە هۆزەبانە بکات چی بکات؟** پرسیار لە (اللجنة الدائمة)کرا: ئەگەر چەند منداڵێکمان هەبوو، لەبەر هەژاری هۆزەبانەمان بۆ هیچیان نەکرد، چونکە من فەرمانبەرم و موچەکەم دیاری کراوە کە تەنها بەشی بژێوی ماڵ و منداڵم دەکات، ئایا حوکمی ئەمە چیە؟

وەڵام: ئەگەر جەنابت هەژاری بەم شێوەی باستکرد، تەنها خۆت وماڵ ومنداڵت پێ بەڕێوە دەچێت، ئەوکات هۆزەبانەت لەسەر نیە، لەبەر ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا﴾(البقرة:٢٨٦)، واتە: خوای گەورە تەکلیفی شتێك لە کەسێك ناکات کە لە توانای نەبێت.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: «فَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَىْءٍ فَاجْتَنِبُوهُ، وَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِأَمْرٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ» (رواه البخاری).

واتە: ئەگەر شتێکم لێ قەدەغەکردن ئەوە مەیکەن، ئەگەر فەرمانی شتێکیشم پێکردن ئەوە ئەنجامی بدەن بە پێی تواناتان. کەوابوو هەر کاتێك بۆت گونجا دەتوانیت هۆزەبانەکە بکەیت.

**○ ئــەو ئاژەڵانــەی دەگــونجێن بــۆ هۆزەبانــە: حــوکمی ئــاژەڵی هۆزەبانـە، وەكـو حـوكمی ئـاژەڵی قوربـانی وایـە، ئـەو ئاژەڵانـەی دەگونجێن بۆ هۆزەبانە:**

- ✓ **الجذع من الضأن: مەڕی یەك ساڵە یان زیاتر.**
- ✓ **الثني من المعز: بزنی دوو ساڵە یان زیاتر.**
- ✓ **الثني من الابل: وشتری پێنج ساڵە یان زیاتر.**
- ✓ **الثني من البقر: ڕەشەولاغی دوو ساڵە یـان زیـاتر، جا مانگا بێ یان گامێش[٥٥].**

**تێبینــی: بـەلاّم نـاگونجێ بـۆ هۆزەبانـە چـەند كەسـێك لـە یـەك ئاژەڵ بەشداربن وەكو قوربانی، كە بەحـەوت كـەس وشترێك یان مانگایـەك بكوژنــەوە، بـەڵكو دەبێـت بـۆ هــەر منـداڵیك ئاژەڵێـك بكرێت بە قوربانی ئەگەر وشتر و مانگاش بێ[٥٦].**

**○ ئاژەڵی عەیبدار نابێ بۆ هۆزەبانە: ئەو ئاژەڵانەی ناگونجێن بۆ هۆزەبانە لەوانە:**

- ✓ **العــوراء الــبین عورهــا: ئــەو ئاژەڵــەی چــاوێكی كــوێربێ بــە ئاشكرایی.**

---

(٥٥) ڕۆژی پرشنگدار: (ل: ٣١٦) عبدالله هەرتەلی.

(٥٦) صحیح فقه السنة(ب:٢/ل:٢٨٤).

✓ العرجاء البين عرجها: ئەو ئاژەڵەی بە ئاشکرا بشەلێ.

✓ المريضة البين مرضها: ئەو ئاژەڵەی بە ئاشکرایی نەخۆش بێ.

✓ العجفاء التي ذهب مخها من الهزال: ئەو ئاژەڵەی لەبەر لاوازی مێشکی نەمابێ[57].

**○ کوڵاندنی هۆزەبانەکە و دەعوت پێ کردنی:** سوننەتە هۆزەبانەکە بکوڵێندرێ ئینجا ببەخشرێ[58]، چونکە ئەگەر بکوڵێنرێ ئەوە زیاتر ئاسانکاری دەبێ بۆ خەڵکی و زیاتر شوکرانە بژێری خوای پێوە دیارە[59]، بەڵام ئەگەر کردی بە خواردن و خەڵکی پێ دەعوت کرد ئەوە زۆر باشترە[60].

(57) ڕۆژی پرشنگدار: (ل: ٣١٦).

(58) تحفة الأحوذي ج٥ ص٩٦ ، وتحفة الودود ص٧٢ .

(59) تحفة الودود ص٧٢ .

(60) المغني ج٨ ص٦٦٣ .

بە پیشتیوانی خوای گەورە تەواو بووم لە نووسینی ئەم کتێبە.. ئەوە منەتی خوایە لەسەر منی بێ دەسەلآت.. خوایە سوپاست دەکەم بۆ ئەو زانستەی پێتداوم.. خوایە ئەم کارەم بۆ بکەی بە قورسای لا تەرازوی چاکەم..

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

**لە کۆتایدا:** خۆشحاڵ دەبم ئەگەر پێشنیار و تێبینی و ڕەخنەکانتانم پێ بگات لە بارەی ئەو کتێبەوە یان کتێبەکانی دیکەم، بەو ناونیشانە:

**فەرمان خەرابەیی/ پێش نوێژ و وتارخوێن/ عیراق / کوردستان / هەولێر**

**پێگەی ئەنتەرنێت:** www.m-farman.com

**فەیسبوك:** www.facebook.com/1farman

**ئیمەیل:** farman@maktoob.com

## پێرستی بابەتەکان

## بەرهەمە چاپکراوەکانی تری نووسەر:

١. ناوە جوانەکانی خوای گەورە.. بە بەڵگەی قورئان وسوننەت.
٢. هۆکارە بەسوودەکان بۆ ژیانێکی ئاسوودە.
٣. زایەڵـــەی شـــادی.
٤. لاوان کاتی نەهاتووە بگەڕێینەوە؟!
٥. کێ دەکەی بە هاوسەری ژیانت؟
٦. ئاوێتەی دڵ/ الفوائد.
٧. خۆشـــەویستی، خوێندنەوەیەکی شەرعیانە و سەردەمیانەوە.
٨. رێبەری نوێژەکان.
٩. تەمەنی زێڕین.. بە فیڕۆی نەدەین.
١٠. ڕاستییەکی ونبوو!
١١. چی دەکەی بۆ کۆرپەکەت؟! ئەم کتێبەی بەر دەستتە.
١٢. زنجیرە چیرۆکی ڕاستەقینە پێك هاتووە لە (١٠) چیرۆك:
- ✓ کاسێتێکی ڤیدیۆ ژیانی لێ تاڵ کردم.
- ✓ گەنجێـــک ئابڕووی پاراستم.
- ✓ ڕۆڵـــــە شیرینـــــەکەم.
- ✓ سارا دوای (٢٢) ساڵ لە گوناھ و تاوان.
- ✓ خۆی و خێـــزانی دۆڕانـــد!!
- ✓ چی بچێنی ئـــەو دە دووریـــەوە.
- ✓ سێ کورتـــــە چـــیرۆک.
- ✓ مۆبایل ژیانی لێ تاڵ کـــــردم.
- ✓ خوشـــکم بۆ ئابـــڕووت بردم!!
- ✓ داب و نەریت بەرەو گۆڕیی بردم.

# لەم كتێبەدا




چەندین خالی گرنگ بۆ ئەو باوك و دایكانە ڕوونكراوەتەوە
كە خوامندالیان پێ دەبەخشێ. مندالّ لەو كاتەی لە دایك
دەبێت سوننەتە چەند شتێكی بۆ ئەنجام بدرێت
كە لێرەدا ڕوونكراوەتەوە

لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی زانکۆ ١

نرخی ( ٢٠٠٠ ) دینارە